# ئەمریکا

**جان گویات**

**و: ئاگری ئەفشین**

**زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان(٥)**

**ناوی کتێب: شۆڕشی ئەمریکا**

**نووسەر: جان گویات**

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئاگری ئەفشین**

**چاپ: ئەلکترۆنی**

**ساڵ: ٢٠١٧**

**٢٠١٧**

## ناوەڕۆك

سێزدە ئەیالەتی باکوری ئەمریکا ١٦٨٩تا١٧٨٣

## پێشەکی:

لە مانگی چواری ساڵی ١٧٧٥ بوو کە نزیکەی ٧٠٠ سەربازی بەریتانی لە ڕێگادا بوون دەچوون بۆ گوندی کەنکورد لە نزیك شاری بوستۆن لە ئەیالەتی ماساچوست، ژمارەیەك پیاوی چەكدار لە لیکزینگتون هێرشیان کردە سەر سەربازەکان، جەنگێك بەرپا بوو کە بووە هۆی کوژرانی هەشت ئەمریکایی. ئەم جەنگە بووە هۆی لێکجیابوونەوەی نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەریتانیا. لەم کتێبەدا کەمێك لە بارەی تێکۆشانی ئازدیخوازنی ئەمریکا، سەرکەوتنەکەیان و ئەو وڵاتەی لەپاش ئەم شۆڕشەوە هاتە بوون دەدوێین.

## موستەعمەراتی پێشین

لە سەدەی حەڤدەیەم و ساڵانی ١٦٠٠ بە دواوە گروپێك لە خەڵکی بەریتانیا و وڵاتانی دیکە ڕوویان کردە باکووری ئەمریکا؛ هۆکاری کۆچ کردنی ئەم خەڵکانە جیاواز بوو. هەندێکیان بە هۆی ئەو سنوردارییە ئاینییەی کە لە بەریتانیا هەبوو و هەندێکیان بە دوای سەروەت و سامانی زۆرەوە بوون بە هۆی چاندنی توتن لە ڤێرجینیا. ئەم کۆچبەرانەی بەریتانیا بە درێژایی زەویە کشتوکاڵیەکانی نێوان زەریایی ئەتڵەس و چیاکانی ئاپالاچین نیشتەجێبوون. بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی خەڵکی کۆچبەر لە هەموو ناوچەکان ڕووی لە زیادبوون کرد و ناوچە و شاری نوێ بەدیهاتن.

لە ساڵی ١٧٥٠م دانیشتوانە نوێیەکانی باکووری ئەمریکا کە ژمارەیان نزیکەی دوو ملیۆن نەفەر دەبوو سێزدە ئەیالەتیان پێکهێنا و بێجگە لە ناوچە سنوریەکان ، هەوڵەکانیان بۆ ڕووبەڕونەوە لە گەڵ سروشت و سورپێستەکان( کە پێیان دەوترێت هیندیە سوورەکان، کۆنترین دانیشتوانی ئەم ناوچانەن) کۆتایی پێهات. لەم ناوچانەدا خەڵکانێکی جیاواز دەژیان: لە بەندەرە گەورەکانی وەکوو بۆستۆن بازرگانە دەوڵەمەندەکان دەژیان و لە موستەعمەرەی باکوور خاوەن زەوییە گەورەکان و جوتیارانی توتن و پەموو دەژیان. هاوشانی ئەم خەڵکە دەوڵەمەندەی ئەم کیشوەرە نوێیە خەڵکانی هەژاریش دەژیان کە خۆیان لە گەڵ خەڵکی دیکە بە یەکسان دەزانی و هەر ئەمەش بوو کە ئەندێشەی ئازادی و بەرامبەری پەیدا بوو، هەڵبەت ئەم یەکسانیە لە بارەی کۆیلە ڕەش پێستەکانەوە نەبوو. هەر یەك لە سێزدە ئەیالەتی موستەعمەرە بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، و پاشای بەریتانیا بە پاشای ئەمریکاش ئەژمار دەکرا و لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم ئەیالەتانە هەندێك ئازادی و سەربەخۆیی تایبەتیان هەبوو وەکوو: ئازادی مەزهەب، ئەنجومەن و جۆرێك لە پەرلەمانی ناوچەییان هەبوو. نۆێنەرانی ئەم ئەنجومەنانە، زۆرجار لە خەڵکانی دەوڵەمەند بوون کە هەڵدەبژێردران و ڕێگەیان بە خەڵکی هەژار نەدەدا کە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەیالەتەکانی خۆیان بەژداربن. و فەرمانداری هەر ئەیالەتێك لە لایان پاشای ئینگلزەوە دیاریدەکرا. هەتا ساڵی ١٧٦٠ سەرانی ئەم سێزدە ئەیالەتە لە بەڕێوەبەری کاروبارەکانیان و بەژدار نەکردنی خەڵکی هەژار لە بەڕێوەبەرایەتی هەمیشە هاوکاری یەکتریان دەکرد. سەرانی ئەم سێزدە ئەیالەتە لە لایان پاشا و پەرلەمانی بەریتانیا سەرپشککرابوون کە بۆ خۆیان یاسای ناوخۆیان دابڕێژن. سوپای بەریتانیاش لەبەرامبەر خوراگری و پاراستنی ناوچەکانیان لە بەرامبەر هێرشی سوورپێستەکان و فەڕانسیەکانی کەنەدا پارێزگاری لێدەکردن.

## یاساکانی موستەعمەرەی کۆن

بازرگانی، کشتوکاڵ و پیشەسازی ئەمریکا بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی بەریتانیا بەڕێوەدەبرا. ئەمریکا ناچار بوو کاڵا و ماددە خاوەکانی پێویستی بازرگانی و کارخانەکانی بەریتانیا

وەکوو پەموو، توتن، دار و پێستی ئاژەڵ فەراهەم بکەن. کارخانە ئەمریکایەکان بەرهەمەکانیان تەنها بەشی ناوخۆی خۆیانی دەکرد، و هەناردەکانی ئەمریکا لە ڕێگەی ئینگلتەراوە دەنێردرایە وڵاتانی دیکە و بەریتانیا نیازەکانی کارخانەکانی خۆی تەنها لە ڕێگەی ئەمریکاوە فەراهەم دەکرد. ئەم نیزامە، پێی دەوترا سیستەمی بازرگانی و ئامانجیان تەنها بەهێز کردن و دەوڵەمەندکردنی بەریتانیا بوو.

جوتیار، ڕاوچی و بازرگانەکان ئەرکی خۆیان لە بەرامبەر فرۆشتنی کاڵاکانیان بۆ خزمەت بە بەریتانیا بە جێدەهێنا بەڵام لە زۆربەی کاتەکان کاری قاچاخ ڕەواجی زۆری هەبوو. زۆربەی خەڵگی ئەمریکا لەو باوەڕدا بوون کە ئەگەر بتوانن خۆیان لە چنگی ئەم سیستەمە بازرگانییەی بەریتانیا ڕزگار بکەن ئەوا دەتوانن ببن بە خاوەن سەروەتێکی زیاتر، و ڕێگری کردن لەم جۆرە بیرۆکانەی ئەمریکیەکان بۆ بەریتانیا ئاسان نەبوو.

نارەزایی ئەمریکیەکان لە سەر یاسای پول و سوتاندنیان.

بەدرێژایی ساڵەکانی ١٧٥٦ تا ١٧٦٣ ئەورووپا دووچاری جەنگێکی حەوت ساڵە بوویەوە. بەریتانیا و فەڕانسە بۆ بەرفراوانکردنی ئەمپراتۆریەتەکەیان و کۆکۆدنەوەی سامانی زیاتر ئەم جەنگەیان تا باکووری ئەمریکا و هیندستان بەرفراوان کرد. بەریتانیا سەرکەوتوو بوو کە بەشێك لە ناوچە ژێر دەستەکانی فەڕانسە وەکوو کانەدا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. کاتێك فەڕانسە هێرشی کرد بۆ سەرزەویەکانی ڕۆژئاوای ئاپاچی تەنها سووڕپێستەکانی ئەو ناوچانە بوون کە ڕووبەڕوویان بوونەوە. دەوڵەتی بەریتانیا ئێستا کەوتبووە بەرامبەر دوو کێشەی گەورەوە.

## داخستنی سنوور

لە بەیاننامەیەکدا داوایان لە هەموو ناوچە موستەعمەریەکان کرد کە کۆچ نەکەن بۆ سەرزەویە نوێیەکان. هۆکاری ئەم ڕاگەیاندنەش ئەوە بوو کە سووڕپێستەکان زۆر توڕە بوون لەو کۆچبەرانەی کە بە چیاکانی ئاپاچیدا تێدەپەڕین و جەنگیش لە گەڵ سووڕپێستەکان خەرجیەکی زۆری دەویست. جەنگی حەوت ساڵە خەرجیەکی زۆری خستە سەر ئینگلتەرا و دابین کردنی پێداویستیەکانی جەنگ بۆ بەریتانیا کارێکی ئاسان نەبوو. لە گەڵ ئەوەشدا بەریتانیا ترسی لەو خەڵکە هەژار و تاوانبارانە هەبوو کە لە سنورەکانەوە تێدەپەڕین لە ژێر کۆنترۆڵی ئەوان دەرچن و دەوڵەمەندەکانی ئەمریکاش بە هەمان شێوە ترسی ئەوەیان هەبوو قەرزدارەکانیان لە دەست دەربچێت. قەدەغە کردنی سەفەر کردن بۆ ڕۆژئاوای ئەمریکا و تێپەڕبوون لە سنورەکان توڕەییەکی زۆری لە لای ناوچە ژێردەستەکان دروست کرد. ئەم یاساغ کردنە بەو مانایە بوو کە ئەو کەسانەی خۆشیان لە دەوڵەتی ئەمریکا نەدەهات دەبوایە گەڕابانەوە بۆ لای سێزدە ئەیالەتەکە و گوێڕایەڵی دەوڵەتی بەریتانیان بکردایە.

## خەرجی جەنگ

بەریتانیا نیگەران بوو لە مەڕ زیادبوونی قەرزەکانی، هەر لە بۆیە دەیویست ئەمریکاش بەژداری پێ بکات لە دانەوەی قەرزەکانی خۆی. بە درێژایی ساڵەکانی ١٧٦٤ تا ١٧٧٠ بەریتانیا بۆ دانەوەی قەرزەکانی باجی لە سەر کەلوپەلەکانی بەریتانیا زیاد کرد و زۆر بە توندی ڕووبەڕوی قاچاخچیەکان بویەوە. زیادکردنی باج و ڕووبەڕبونەوەی قاچاخ بازرگانەکانی ئەمریکای توڕەکرد؛ هیچ کام لە بازرگانە ئەمریکیەکان ئامادە نەبوون ئەو باجە زیادەیە بدەن بە بەهانەی ئەوەی کە هەتا بەریتانیا ڕێگە نەدات کە ئەمریکیەکان نوێنەریان لە پەرلەمانی ئەو وڵاتەدا هەبێت ئەوا ئەوانیش باج نادەن. دروشمی بازرگانە ئەمریکیەکان ئەوە بوو کە دەیانووت( بە بێ هەبوونی نوێنەر لە پەرلەمانی بەریتانیا هیچ باجێك بوونی نییە). ئەوەی کە ببوە هۆی هەڕەشە بۆ سەر ئابووری ئەمریکیەکان بابەتێك بوو کە ئازادی و یاساکانی ناوخۆی ئەمریکاشی خستبووە ژێر هەڕەشەوە. ئەوەی کە لە سەرەتادا تەنها جەنگی قسە بوو ببوە هۆی ئەوەی مەجلیسی مەستەعمەرەی سێزدە ئەیالەت لە بەریتانیا دووربکەونەوە، بازرگانە ئەمریکیەکانیش

WILLIAM JACKSON,
an IMPORTER; at the
BRAZEN HEAD,
North Side of the TOWN-HOUSE,
and Opposite the Town-Pump, in
Corn-hill, BOSTON.

It is desired that the Sons and Daughters of LIBERTY, would not buy any one thing of him, for in so doing they will bring Disgrace upon themselves, and their Posterity, for ever and ever, AMEN.

بەیاننامەی قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنی کاڵای هاوردەکراو کە پولی پێوە بوو.

خۆیان بە دوورگرت لە کڕینی شـتومەکی بەریتانی و بـەیـاننـامـەیکیشــیـان دژی بـەریـتـانیـا نووســی. دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا لەم ڕەفتارەی خەڵك بۆ دژایـەتی ئینگلیز و ئـەوەی کـە لـە لایـان خـەڵکی هەژارەوە پیادە دەکرا ترسـیان لێ نیشـتبوو. دەوڵەتی بەریتانیا گوێی بە خواستەکانی خەڵکی هەژار نەدەدا. خەڵکی هەژار لەم دەرگیری و کێشمەکێشمەدا هیچیان نەبوو کە لە دەســتی بدەن بۆیە هەرچـــیەکیان لە دەســت هاتبایە بۆ خراپترکردنی پەیوەندی ئەم دوو حکومەتە کەمتەرخەمیان نەدەکرد.

لە ســاڵی ١٧٧٠ هەوڵدرا کە ناکۆکی و ســەختیەکانی نێوانیان بەرەو باشتر بوون بچن بەڵام بە کردار، هیچ شـتێك نەکرا. ئێسـتاکە سـەروەتمەندانی ئەمریکایش خوازیاری ئازادی تەواوی موسـتەعمەرە ئەمریکیەکان بوون لە دەست بەریتانیا وهەر لەبەر ئەوەش بوو کە ناکۆکیەکانی نێوانیان ڕووی لە زیادبوون کرد. هەر لەو ســاڵەدا کاتێك ســەربازە بەریتانیەکان بە هۆی شــۆڕشــێك گەمارۆ دران، دەســتەیەك لە هەر دوولا کوژران و لەبەر ئەوە هەســتی دژ بە ئینگلیز ڕووی لە زیاد بوون کرد. لە گەڵ هەموو ئەمانەشـدا هێشـتا بۆ ڕێگری کردن لە جەنگ درەنگی نەکردبوو.

## دەستپێکی جەنگ

دەوڵەتی بەریتانیا دەســتی بۆ کارێکی نەشــیاو برد ئەویش ئەوە بوو کە ڕێگەی بە کۆمپانیای ئینگلیزی ڕۆژهەڵاتی هیندستان دا کە چایی بە نرخێکی هەرزان بخاتـە بـەردەســتی خـەڵکی ئـەمریکـا. گـەرچـی کۆمپانیایەکە ســوودێکی زۆری وەبەرکەوت بەڵام بـازرگـانـە ئـەمریکیـەکـان زۆریـان زیـان وێکـەوت و توڕبوون، دووبارە هەســتی دژ بە بەریتانیا گەیشــتە لوتکە. گروپێك لە بازرگانەکانی بۆســتۆن بە جل وبەرگی ســوورپێســتەکان چـوونە ناو کشـتیەکەوە و هەموو چـــایەکەیان فڕێدایە ناو دەریاوە. دەوڵەتی بەریتانیا لە تۆڵەی ئەم کارە کەنارەاوەکانی بۆســتۆی داخســت و کرێکارە ئەمریکیەکانیشــی دەرکرد. لە وەڵامی ئـەم کـارەش نوێنـەرانی ســیـانزە ئـەیـالـەت کۆنگرەی کیشــوەریان بەســت و بازرگانیان لە گەڵ بەریتانیا ڕاگرت؛ جگە لەوەش هەر لەم دانیشــتنەدا، کۆنگرە ســوپایەکی پارتیزانی بۆ هەر هێرشــێکی لە ناکاوی بەریتانی ئامادە کرد. لە ساڵی ١٧٧٥ قەیرانەکان گەشــتبوونە لوتکە. لە ١٩ی مانگی چــوار فرماندەی بەریتانی تۆماس گەج ســوپایەکەی خۆی نارد بۆ کۆنگۆ و جەنگ دەستی پێکرد.

میوانداری چای لە بۆستۆن

هەوەڵین جەنگ لە نێوان ئەمریکا وبەریتانیا ١٧٧٥

هەڵکردنی ئەوەڵین ئاڵای ئەمریکا لە یەکی مانگی یەکی ١٧٧٦

ئیمزاکردنی جاڕنامەی سەربەخۆیی

## ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی

نزیك بە ساڵێکی تەواو بەریتانیا و سیانزدە ئەیالەتی ئەمریکا لە جەنگ کردن بەردەوام بوون. جەنگی بەریتانیا و ئەمریکا بووە هۆی لێکجودای و گفتوگۆی بەرفراوان و پەیدابوونی گروپی نوێ دژ بە ڕێبازی سیاسی بەریتانیا.

گەرچی جەنگی بەریتانیا و ئەمریکا جەنگێکی پەرتەوازە بوو و دەکرا کۆنترۆڵ بکرێت بەڵام جۆرجی سێیەم پادشای بەریتانیا کە پێی وابوو شەڕکەرەکانی ئەمریکایی بێ توانان، بۆیە سەربازی زیاتری بۆ لەناوبردنیان نارد.

IN CONGRESS, JULY 4, 1776.

The unanimous Declaration ... States of America.

جاڕنامەی سەربەخۆیی

سزادانی لایەنگرانی بەریتانیا

کۆنگرەی گشتی ئەمریکا لە وەڵامی بەریتانیا خوازیاری هەر چی زووتر سەربەخۆیی یەکجاری بوو. نوێنەرانی کۆنگرەی گشتی لەوباوەڕەدابوون کە نیزامی داگیرکاری بازرگانی کۆن کۆتایی پێهاتووە و بەندەرەکانی ئەمریکا دەبێ بە ڕووی بازرگانەکانی هەموو وڵاتاندا کراوە بن. جۆرج واشینگتۆن کە خەڵکی ڤێرجینیا بوو کرایە فەرماندەی سوپای ئەمریکایەکان و بەیاننامەی سەربەخۆیی ئەمریکا دەرچوو. دەرکردنی ئەم بەیاننامەیە کە خواستەکانی خەڵکی ئەمریکاشی لە خۆگرتبوو بە مانای ئەوە بوو کە بەردەوام بوون لە خەبات هەتا سەربەخۆیی تەواو.

## جەنگ

لەم قۆناغەدا نزیك بە یەك سێیەمی خەڵکی ئەمریکا ئامادەی جەنگ بوون لە گەڵ بەریتانیا، یەك لە سەر سێی خەڵك چاوەڕوانی ڕووداوەکانی داهاتوو بوون و نزیك بە سێیەکی دیکەش کە لە دەوڵەمەندەکان بوون وەفادار بوون بە حکومەتی بەریتانیا و لە هەوڵی پاراستنی ئاسایش و یاسا بوون لە لایان حکومەتی بەریتانیەوە. لە سەرەتادا وا دەهاتە پێش چاو کە بەریتانیا لەم جەنگەدا سەرکەوتوو دەبێت. لەبەرئەوەی ئەمریکا هێزی دەریایی تەواوی نەبوو ، نە سوپای تەواویشی هەبوو نە دەوڵەتیشی هەبوو، بەڵام لەبەرامبەردا بەریتانیاش ٣٠٠٠ میل دورتر لە سەرزەوی خۆیان دەجەنگان و ئەمریکیەکانیش ئاشناتر بوون بە ناوچەکانی خۆیان تا سەربازە بەریتانیەکان. لە سەرەتادا جەنگاوەرە ئەمریکیەکان سوودیان لە ڕەوشی پەلامار وڕاکردن وەردەگرت و لە هەر دەرفەتێکدا کە هاتبایە پێش هێرشیان دەبردە سەر بەریتانیەکان و زیانیان پێ دەگەیاندن. فەرماندە ئینگلیزیەکان فەرماندەی سەرکەوتوو نەبوون و جەنگاوەرە

کۆمەڵگەی جەنگی لە دۆڵی فۆرگ

ئەمریکیەکانیان بە کەسانێکی تەمبەڵ و بێ ئەزموون لە قەڵەم دەدا و کاتێك کە بە هۆش هاتنەوە کە ئیتر درەنگ ببوو.

ڕێکخستنی سوپای ناسیستماتیکی ئەمریکا بۆ جۆرج واشینگتۆن کارێکی دژوار بوو. واشینگتۆن لە مەیدانی جەنگ فەرماندەیەکی گەورە نەبوو بەڵام بە هۆی سەبر و خۆڕاگریەکەی ببووە هۆی جێی متمانەی سەربازەکانی و ڕێزیان لێدەگرت. زۆرێك لە سەربازەکانی سوپای واشینگتون مەیلیان بە گوێڕایەڵی بۆ یاسا و ڕێسا نەدەداو تەنها لەبەرئەوە لە گەڵ بەریتانیەکان دەجەنگان کە نەیاندەویست فەرمانبەری لەندەن بن و هەرلەبەرئەوەش نەیاندەویست گوێڕایەڵی ئەفسەرەکانی خۆیان بن. گروپێك لەم سەبازانە جەنگاوەری وەرزی بوون، کە بە پێی ڕێکەوتنێك تەنها لە ماوەیەك لە جەنگ بەژدار دەبوون و لە کاتی وەرزی کشتوکاڵ دەگەڕانەوە بۆ کیلگەو باغەکانی خۆیان. بەم پێیە زۆربەی کاتەکان ژمارەی جەنگاوەرەکانی جۆرج واشینگتۆن زیاتر لە ٥٠٠٠ نەفەر نەبوون و تەنها یەك جار گەیشتە ٢٠٠٠٠ نەفەر. بەریتانیا لەم جەنگەدا بێجگە لەسەربازەکانی خۆی ٣٠٠٠٠ بەکرێگیراوی ئەڵمانیشی لە گەڵ بوو. کاری گرنگی واشینگتۆن لەم جەنگانە پاراستنی مانەوەی سوپای ئەمریکا بوو و باشترین نمونەش لەم بارەیەوە پاراستنی سوپاکانی

خەڵاتی مەدالیا کە دەدرا بە سوورپێستەکانی لایەنگرانی بەریتانیا (سوورپێستەکانی ئیراکوا)

ئەمریکا بوو لە زستانی ساڵی ۱۷۷۷. لەم ساڵەدا واشینگتۆن بە بێ حساب کردن بۆ هێزی سوپای ئەمریکا هێرشی کردە سەر سوپای ئینگلیز بەڵام سوپاکەی واشینگتۆن بە سەختی زیانیان بەرکەوت. واشینگتۆن سوپا پەرتەوازەکەی لە دۆڵی فورگ کۆ کردەوە لە گەڵ کەمبودی خۆراك و جلو بەرگی زستانە توانی تەنها بە هەبوونی ژمارەیەکی کەم چادر و پێخەو سوپای ئەمریکا لەم قەیرانە ڕزگار بکات.

## ساراتوگا و فەرانسە

لە زۆرترینی جەنگەکان، سوپای ئەمریکا هەمیشە خۆی دەبوارد لە جەنگی ڕووبەڕوو. بۆیە هەمیشە پشتی بە ڕەوشی پەلامارو هەڵاتن دەبەست. جارێك بەریتانیا بۆ پاسەوانی کردن لە ڕێگای شەمەندەفەر بۆ بارکردنی پێداویستیەکانی جەنگ کە نزیکەی ۱۵ میل دەبوو، ۳۰۰۰ جەنگاوەری دیاریکرد بۆ پاراستنی ڕێگاکە لە هەر هێرشێکی لە ناکاوی سوپای ئەمریکا. جۆرج واشینگتۆن لەوە دڵنیا بوو کە بۆ وەدەرنانی بەریتانیا لە ئەمریکا دەبوایە ئەوان لە جەنگێکی گەورە شکست پێ بێنێت و هەمیشە بە دوای ئەو دەرفەتەوە بوو. هەوەڵین دەرفەت لە ساڵی ۱۷۷۷ هاتە پێشەوە؛ لەو ساڵەدا گروپێکی گەورە لە سوپای بەریتانیا لە ڕێگەی کانەدا دەیانویست بچنە پاڵ سوپای ئینگلیز لە باکووری نیویۆرك. فەرماندەیی سوپای بەریتانیا لە نیویۆرك بەر لەوەی بڕوات بۆ گەیشتن بەو گروپەی کە لە ڕێگەی کانەداوە هاتبوون،

جەنگی دەریایی: جەنگی نێوان بونوم ڕیچارد لە گەڵ سراپیس فەرماندەی دەریاوانی ئینگلیز کە لەم جەنگەدا سراپیس شکستی هێنا.

ویستی سوپاکەی واشینگتۆن دوور بخاتەوە بۆ باشوور بەڵام بە هۆی ئەم کارەوەیەوە نیوێك لە سوپاکەی بەریتانیا لە ناوچوون. سوپای کانەدا کە لە ڕێگەی دارستانە چڕەکانەوە بەرەوە باکوور بەڕێکەوتبوو لە لایان گروپێك لە چریکەکانی ئەمریکایی هێرشیانکرایە سەر. بورگوین فەرماندەی سوپای کانەدا دەڵێ: (بە بێ هیچ هاوکارێکی سوپای ئینگلیز کە لە نیویۆرك جێگیرکرابوون، ئێمە بە تنها مابوینەوە وە مەجبوور بوین لە کوێرە ڕێگاکانی ناو لادێکانەوە تێپەڕبین). لە گەڵ گەیشتنی وەرزی پاییز زۆرێك لە سوپاکەی بورگوین لەناوچوون و ئەوانەشی مابونەوە بارودۆخێکی دشواریان هەبوو. ئەوانەی لە سوپاکەی بورگوین مابونەوە لە ناوچەی ساراتوگا لە لایان جەنگاوەرە ئەمریکیەکانەوە ئابلۆقە دران و لەناوچوون. یەکێك لە فەرمانەدەکانی سوپای بورگوین دەنوسێت: شەهامەت و ئازایەتی جەنگاوەرە ئەمریکیەکان هەمووانی دووچاری سەرسوڕمان کردبوو، ئێستا بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئێمە ئەوان زۆر بە هێز بوون).

فەڕانسیەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوە و دەستیان کرد بە دوژمنایەتی کردن لە گەڵ بەریتانیا و داوای ناوچە داگیرکراوەکانی خۆیان دەکردەوە لە ئەمریکا. سوپای فەڕانسە لە ساڵی ١٧٧٨ بە شێوەیەکی ڕەسمی هاتە پاڵ سوپای ئەمریکاو کەوتە جەنگ لە دژی بەریتانیا. لە گەڵ هاتنی فەڕانسە، ئیسپانیا و هۆڵەنداش هاتنە پاڵیان بۆ شکستی یەکجاری بەریتانیا. ئێستا ڕەوانەکردنی پێداویستی و هاوکاری جەنگی لە ڕێگای دەریایی بۆ باکوری ئەمریکا کارێکی سەخت بوو بۆ بەریتانیا و کەشتیە جەنگیەکانی فەڕانسەو هۆڵەند پەلاماری کەشتیەکانی بەریتانیایان

دەدا. لە کاتی ئاشــکرا کردنی جەنگ لە کەناراوەکانی بەریتانیا، هەناردەکردنی هاوکاری بۆ ئەمریکا کارێکی مەحاڵ بوو. سەرەنجام دەریاوانانی فەڕانسە لە ڕێگای ئاویی و ســـوپای ئەمریکاش لە ڕێگای وشــــکانی لە ناوچــــەی یورکتان بەشـــێکی گەورەیان لە ســـوپای بەریتانیا لەناوبرد. لە ساڵی ١٧٨٣ سەرەنجام بەریتانیا ئامادەی نیشــــان دا بە ســــەربەخۆی ئەمریکا، بەڵام کانەدا هێشـــتا شـــوێنی پەنادانی لایەنگرانی دەوڵەتی بەریتانیا بوو و پەناگایەك بوو بۆ ئەوانەی کە ئەمریکایان جێهێشتبوو. سیاسەتمەدارانی بەریتانیا پێشـــتر ئەم ناوچـــە ژێردەســتانەیان بە ســـەرچـاوەی هەمیشـــــەی دارایی خۆیان دەزانی بەلام لە کۆتادا ئازایەتی جەنگاوەرەکانی ئەمریکا، ڕێبەری جۆرج واشـــینگتۆن و پشـــتیوانی فەڕانســـە لە جەنگی دژ بە بەریتانیا، چۆکیان بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا دادا و شکستیان پێهێنا.

## دەستوور

دە گەڵ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، سێزدە ئەیالەتی خۆبەڕێوەبەر توانیان لە ژێردەســـــتەیی ئابووری ڕزگاریان بێت و لە گەڵ ولاتانی ڕۆژئاوا و ولاتانی دیکە پەیوەندی ئابووریان بەســـت. لە پاش ســــــەربەخۆیی هەوەڵین بابەت، چـــلۆنایەتی بەڕێوەبردنی ولات بوو و بابەتی دەوڵەت بوو. بە درێژایی ســـاڵەکانی ١٧٨٣ تا ١٧٨٧ هەریەکە لەم ئەیالەتانە خاوەن حکومەتی بەڕێوەبەری بوون و کۆنگرەی گشـتیان هەبوو، بەڵام دەســـەڵاتێکی زۆریان نەبوو. هەموو ئەم ئەیالەتانە لە گەڵ جاڕنامەی سـەربەخۆیی لەوانە ئازادی مەزهەب، زمان، یاسـاکانی خاوەنداریەتی و شـتەکانی دیکە هاوڕابون؛ و هەروەها لەســــەر ئەوەش ڕێکەوتبوون کە( ئەگەر دەوڵەتێك پێچـــەوانەی خواســـتەکانی خەڵکی بجوڵێتەوە..ئەوا خەڵك ئازادن کە چاکسازی بکەن یان بیگۆڕن) بەڵام زۆرێك لە ئەمریکایەکان ئامادە نەبوون گەردن کەچـبن بۆ هێزی دەسـەڵات، ئەوان لە گەڵ بەریتانیا جەنگان بۆ ئەوەی لە ژێر دەســــەڵاتی بەریتانیا ڕزگاریان بێت. لەم ڕووەوە حکومەتە ناوچـــەییەکان لەبەرامبەر خەڵك دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبوو و ئەم بابەتەش ببوە هۆکاری ترس ودڵەڕاوکێ لە لای دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا. لە ســــاڵی ١٧٨٦ لە ماساچۆست خەڵکی ئەو ناوچەیە هێرشیان بردە سەر یەکێك لە دادگاکان کە دادوەرەکانی ســـــەرقاڵی کۆکـردنـەوەی قـەرزی قـەرزدارەکـان بـوون بـۆ دەوڵەمەندەکان، کاتێك یەکێك لە فەرماندەکان ئەم شورشەی سەرکوب کرد بیری کردەوە و وتی: ( دەوڵەت دەبێ ئەوەندە بە توانا بێت کە ژیان و ماڵی خەڵك لەم ڕوداوانە بپارێزێت).

ســــەرەنجام لە ســـــاڵی ١٧٨٧ بە هۆی ڕێکخســـتنی کۆنگرەیەك لە ئەمریکا بۆ بەدەستهێنانی حکومەتێکی بە هێزتر، لە پاش گفتگۆیەکی زۆر (دەســـــتووری ئەمریکا) بەرهەمی ئەم دانیشتنەیان بوو. نووسەران و بونیادنەرانی دەســــتووری ئەمریکا لە مێژووی ئەم ولاتەدا بە (باوکی بونیادنەر) ناوبانگیان هەیە. بە پێی دەســـــتوور، ســــێزدە ئەیالەتی باکووری ئەمریکا خاوەن حکومەتی بەڕێوەبرین. و بۆ لەبەرچاوگرتنی

جان ئادامز هەوەڵین باڵیۆزی ئەمریکا لە بەریتانیا ١٧٨٥

زۆرینەی ئازادی تاکە کەسی بۆ سنوردارکردنی هێزی لە ڕادەبەدەری حکومەتی ناوەندی، نوێنەرانی کۆنگرە مافی ئەوەیان هەبوو لە کاتی ڕوداوێکی گرنگ ئەویش بە ڕێگای گفتوگۆ نەك لە ڕێگای جەنگ و خوێنڕشتن دەتوانن هەتا گۆڕانکاری لە دەستووریشدا بکەن.

## دەوڵەت و هاوسەنگی هێزەکان

بونیادنەرانی دەستوور لەو فکرەدابوون کە ڕێگربن لە بە هێزبوونی دەسەلاتخوازەکان. بڕوایان وابوو کە ئەگەر تاکە کەسێك یان گروپێك یاسا دابنێنن یان بەڕێوەی ببەن بێگومان ڕوو لە دەسەلاتخوازی دەکەن. لەبەرئەوە بوو کە ڕێکخەرانی دەستوور سەرۆك کۆماریان هەڵبژارد بوو بۆ ڕاپەڕاندنی یاساکان و ڕێکخستنی یاساکانیش سپێردرابوو بە کۆنگرەی ئەمریکا. بە پێی دەستوور، سەرۆك کۆمارو نوێنەرانی کۆنگرە هەریەکەیان بە جیا لە لایان خەڵکەوە هەڵدەبژێردران و لە گەڵ ئەوەشدا لە دەستووردا دادگای باڵا لەبەرچاوگیرابوو کە گەورەترین مەرجەعی دادوەری ئەمریکا بوو. سەرۆك کۆمار و نوێنەرانی کۆنگرە هەریەکەیان ئەرکی ئەوەیان هەبوو کە ڕێگری لە یەکتری بکەن کە هیچکامیان مەیلی دەسەلاتخوازی پەیدا نەکەن لەم نێوانەشدا دادگای باڵا داوەری دەکرد لە نێوانیان کاتێك کێشەو ناکۆکیەکان ئاشکرادەبوون. بونیادنەرانی دەستووری ئەمریکا ئومێدەواربوون کە هاوسەنگی بەشەکانی دیکەی وڵات پارێزراو بێت و ڕێگربن لە پەیدا بوونی دیکتاتۆرێك.

جۆرج واشینگتۆن هەوەڵین سەرۆك كۆماری نەتەوەیەكگرتووەكانی ئەمریكا لە كاتی سوێند خواردن

## ئەیالەتەكان و دەوڵەتی فیدراڵ

لە دەســـــتووری ئەمریكادا یەكێك لە بابەتە هەر گرنگەكان كێبڕكێی ئەیالەتە جیاوازەكان بوو لە مەڕ ســـنوردارکردنی دەســـــەڵاتی هـەر یـەكـەیـان. ئـەو ئـەیـالـەتـانـەی كـە گـەورە بوون وەكوو ڤیرجینیا و ماساچوست لە بەرامبەر ئەیالەتە بچوكەكانی وەكوو نیوجرسی و دیلوارە داوای دەسەڵاتی زیاتریان دەكرد و هەتا داوایان دەكرد نوێنەرانیش بە پێی ژمارەی دانیشـــتوانی هەر ئەیالەتێك بچـــنە كۆنگرەوە. بەڵام ئەیالەتە بچـــوكەكان لە گەڵ ئەم نیزامە كە دەبووە هۆی دەسەڵاتخوازی هاوڕانەبوون. ئەیالەتە بچوكەكان خوازیـاری هـەڵبـژاردنی هـەر نوێنـەرێك لـە هـەر ئەیالەتێك بوون و ئەم بابەتەش بۆ خەڵكی ڤێرجینیا كە خۆیان لە خەڵكی ئەیالەتەكانی دیكە باڵاتر دەزانی ئەم نیزامەیان پێ قەبوڵ نەدەكرا. سەرەنجام كێشەكە بەم جۆرە چـــارەســـەركرا كە جگە لەوەی كۆنگرەی ئەمریكا نوێنەرەكانی بە پێی ژمارەو ڕووبەری هەر ئەیالەتێك دیاریدەكات، مەجلیسێكی دیكەشی بە ناوی ســـەنا بونیادنا كە لە هەر ئەیالەتێك یەك نوێنەری وەردەگرت. بـە پێی دەســـتوور، پـەیوەنـدی یـەكێتی ئەیالەتەكان لە گەڵ وڵاتەكانی دیكە، لەبارەی جەنگ و ئاشـــتی وبەســـتنی ڕێكەوتنە بازرگانیەكان لە گەڵ وڵاتانی دیكە لە ئەســـتۆی حكومەتی ناوەندی یا حكومەتی فیدراڵ بوو، و ئەوەی لە ئەستۆی ئەیالەتە خۆبەڕێوەبەرەكاندا بوو بریتی بوو لە ڕێكخستنی یاسا ناوخۆییەكان، دادگا ناوچـــەییەكان، ســـیســـتەمی پەروەردە وفێربوون.

لە پاش گفتگۆیەکی زۆر سەرەنجام دەستووری نوێ لە ساڵی ١٧٨٨ لە لایەن خەڵکی ئەمریکاوە پەسەندکراو جۆرج واشینگتۆنیش لە مانگی چواری ساڵی ١٧٨٩ بوو بە هەوەڵین سەرۆك کۆماری ئەیالەتە یەکگرتووەکان. ئەیالەتە یەکگرتوەکان لە کاتی بوونە سەرۆك کۆماری جۆرج واشینگتۆن دانیشتوانەکەی نزیکەی چوار ملیۆن بوو.

## جمهووری نوێ: فیدراڵیستەکان و کۆمارییەکان

لە دوای بە دەستهێنانی سەربەخۆیی ئەمریکا نزیکەی سی ساڵ سەرانی ئەمریکا هەر لە خەڵکی ئەیالەتەکانی ماساچوست و ڤیرجینیا بوون. لەو سەردەمە لە بارەی شێوەی حکومەت ڕێکەوتنی تەواو نەبوو. لە ساڵی ١٧٩٠ گروپێك لە سیاسەتمەدارە دەوڵەمەندەکان لە ژێر ناوی فیدراڵیستەکان دەسەلاتیان گرتە دەست. فیدراڵیستەکانیش، هەروەکوو زۆرێك لە بازرگانە دەوڵەمەندەکانی بۆستۆن و نیویۆرك خوازیاری دەسەلاتی زیاتر بوون بۆ حکومەتی ناوەندی، سنووردارکردنی هەژارەکان، بونیادنانی لەنگەرگای گەورە ، دروست کردنی ڕێگای بازرگانی، دروستکردنی کارخانەی گەورە و شاری گەورە و گۆڕینی ئەمریکا بوو بۆ وڵاتێکی پیشەسازی. ئەوان لە سەر ئەو باوەڕەدا بوون کە دەوڵەت دەبێ لە گەڵ بەریتانیا کە پشتیوان و شەریکی بازرگانی ئەمریکایە ڕێگای دۆستایەتی بگرێتە بەر. فێدراڵیستەکان داهاتووی ئەمریکایان لە دۆستایەتی کردنی بەریتانیا دەبینیەوە بۆیە دەیانڕوانیە ئەو بەری ئوقیانووسی ئەتڵەنتیك و هیچ گرنگیەکیان نەدەدا بە ئەو سەروەت وسامانەی لە ڕۆژئاوای ئەمریکا هەبوو.

لە بەرامبەر فیدراڵیستەکاندا گروپێکی دیکە هەبوون کە ناویان کۆمارییەکان بوو و تۆماس جیفرسۆن سێیەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا ڕێبەرایەتی ئەم گروپەی دەکرد. پیاوانێکی وەکو جیفرسۆن داهاتووی ئەمریکایان لە ڕۆژئاوای ئەمریکادا دەبینیەوە وهیچ چاویان لە ئەوروپا نەبوو. جیفرسۆن بۆخۆی جوتیار بوو و ژیانی لادێی پێ باشتر بوو؛ ئەو لە شارە گەورەکان بێزاربوو و دەشتە پان وبەرینەکانی ڕۆژئاوای ئەمریکای وەکوو ماڵی هەر کەسێکی ئازاد دەزانی. جیفرسۆن ئەمریکای وەکو کەرەمێك بۆ هەر مرۆڤێك دەزانی و پێی وابوو کە ئەمریکا سەرزەمینێکە کە هەموو خەڵك دەتوانن بە شێوەیەکی ئازاد تێیدا بژین بە بێ پشت بەستن بە ئەورووپای پەکەوتوو. ئەو وا بیری دەکردەوە کە ئەمریکا بە ڕێژەی پێویست زەوی وزاری هەیە بۆ کشتوکاڵ کردن کە تێیدا نابێت کەس ئاغا و نۆکەری کەسێکی دیکە بێت. جیفرسۆن خوازیاری ڕەدکردنەوەی کۆیلەگەری بوو و دەیویست بەردەکان ئازاد بن. لە سەردەمی جیفرسۆن نەتەوە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەو زەویانەی لە فەڕانسە کڕیەوە کە دەیانووت موستەعمەرەی ئێمەن و هەزاران کیلۆمەتر چوارگۆشە زەوییەکانی ڕۆژئاوای میسیسی پییان بە ڕووی دانیشتوانە نوێیەکاندا کردەوە.

بینای یادکردنەوەی واشینگتۆن کە بەردەکانی لە هەموو ئەیالەتەکانەوە بەدەستهاتبوون.

## گرنگی شۆڕشی ئەمریکا

جەنگی سـەربەخۆیی ئەمریکا تا چـی ئاسـتێك بە شـۆڕشـێك ئەژمار دەکرێت؟ و تا چ ڕادەیەك ئەم شـۆڕشـە گۆڕانکاری بە خۆیەوە بینی؟ هەرچـی بوو ئەمریکا توانی لە ژێر چـنگی بەریتانیا خۆی ڕزگار بکـات و ئـازادی بـەدەسـت بهێنیـێت. لـە دوای نووسـینەوەی دەسـتوور خەڵکی ئەمریکا لە کۆتایدا ملیان بۆ یاسـا دانەواند. فێدراڵیسـتەکان هیچـیان بۆ نـەکرا، بـەڵان خـەڵکـانی فـەقیریش دەسـتیـان بـە خواسـتەکانیان نەگەیشت بۆ دانەوەی قەرزاکانیشیان ناچـار بوون بەرەو ڕۆژئاوا کۆچ بکەن و لە گەڵ سـوورپێسـتەکان یاخود هیندیە سـوورەکان بکەونە جەنگەوە. جاڕنامەی سـەربەخۆیی باسـی لە ئازادی و یەکسـانی بۆ هەمووان دەکرد بەڵام سـیسـتەمی کۆیلایەتی لە ئەیالەتەکانی باشـووری ئەمریکا تا ١٨٦٥ بەردەوامی هەبوو. سپی پێستەکان لەبەرامبەر یاسادا بەرابەر بوون بەڵام لە دابەش کردنی سـەروەت و سامان ئەم یەکسان بوونە ڕەچاونەدەکرا.

خەونی فیدراڵیستەکان بۆ ئەمریکایەکی پیشەسازی و خەونی جیفرسـۆنیش بۆ ئەمریکایەکی کشتوکاڵی لە ساڵانی دواتر کاریگەرێکی بەرچاوی هەبوو. ئەمریکا گۆڕدرا بوو بۆ وڵاتێکی زەبەلاح لە بواری پیشەسازی ، پێکهاتبوو لە شـاری گەورە و دەوڵەمەندی زۆر و دەسـەڵاتخواز. بـەڵام بـە هۆی کشـتوکاڵکردن لـە زەویەکانی ڕۆژئاوا ئەمریکا توانیان بەشـی خۆیان بەدەسـت بێنن(گەرچـی لەم ڕێگایەشـدا هەر دەوڵەمەندەکان زیاتر سوودمەند دەبوون).

ئەمریکای ئەمڕۆ

ئەمریکا سەرزەوییەك بوو كە هەر مرۆڤێكی ئازاد دەیتوانی هەرشتێك بەدەست بێنێت كە ویستی لێبا و ئەگەر بەسەختی تەلاشی كردبا و دەرفەتێك هاتبایە پێش دەیتوانیٚ سەروەت سامانێك بۆ خۆی پێكەوە بنێت. بۆ ئەمریكیەكان ئازادی، ماڤ مرۆڤ و ئەركی هەر مرۆیەك بە جۆرێك بوو كە كە هەر ئینسانێك بتوانیٚ بە ڕێگایەك ژیانی خۆی ئیدارە بكات. ئەمریكا بۆ ملیۆنان كۆچبەری ئیتالیایی، ئیرلەندی، جولەكە، ئەڵمانی ،پۆڵەندی و سوێدی سەرزەوی ئازادی و خۆشبەختی بوو. لە كۆتایی

جەنگەكانی سەربەخۆی ئەمریكا جۆرج واشینگتۆن دەیوت: (ئەمریكیەكان لە بارودۆخێكدان كە ئیرەییان پێدەبردرێت، ئەوان خاوەن زەوی وزارێكی زۆرن كە لە كیشوەرێكدا دەژین ئاو هەوایەكی مامناوەند و سەرزەویەكی فراوان و بارودۆخێكی ئارامی هەیە). دووسەد ساڵ دواتر ئەمریكا بوو بە وڵاتێكی پیشەسازی قودرەتمەند لە جیهاندا بەڵام هێشتا دەستوورەكەی وەبیرهێنەرەوەی خەونەكانی سەرەتایی سەربەخۆییە.